کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی شیعر (١٩)

# دیوانی بنەوشەکان

عبدالرزاق بیمار

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی شیعر (١٩)

# دیوانی بنەوشەکان

عبدالرزاق بیمار

بەغدا ——————— ١٩٨١

# ئەم کۆمەڵە هەڵبەستە

★ هەڵبژاردەیەکی سەرپێی بەرهەمی شیعرەکانمە کە لە ماوەو کاتو شوێنی جیاجیادا دانراونو هیچیان هی ئەمڕۆ نین بۆیە دوور نییە هەر بە چاوی کەلەپوور سەیریان بکەمو چاپو بلاوکردنەوەشیان ئەوەندە دلم خۆشنەکات وەکو ئەوەی یەکێك نۆبەرەیەکی خۆی ببینێ بەڵکو هەر بەو شێوەیە کە بەرهەمێکنو بە کوردی نووسراون ، ئەگەر لە رووی هونەریشەوە نرخو تامێکیان پێوە بێ ئەوە خوێنەواران دەیزاننو یەخەی ئەوان دەگرێتەوە .

★ شتێك کە لە گوڵی خۆی نەیەتە بازارەوە لەوانەیە بازاری سارد بێو ئەوەندە سەرنجی دلدارانی خۆی رانەکێشێت ، وا ئەم کۆمەڵەیەش کە دێتە بازاری ئەدەبەوە ، لەوە دڵنیام شیعرەکان ئەوەندە سەرسەختنو کەللەرەقن بێناز ناکەون ، یان هەر هیچ نەبێ خۆیان بەبێناز نازانن . با ئەم جارەش وەکو دۆڕاندنو لێرووخانی هەلو دەرفەتەکانی تری چاپو بلاوکردنەوەیان بێت لە ماوەی ٢٠ ، ٣٠ سالدا . با بزانین چۆن دەبێت ؟

بیمار

بەغدا ـ ١٩٨٠/٣/١١

**کاکەی بیمار !**

ئەم کۆمەڵە شیعرە ، بە لای منەوە ، وەك چەپکە گوڵێکی ژاکاوو سکاڵایان لە دەم‌و ڕوومەت نەبارێ ، لە داڕشتن‌و کێش‌و ئاهەنگ ، جۆرە بەهرەیەکیان تیادا بەدی ئەکرێ .. بەڵام وەك دەرنەکەوێت دادو بێداد لە دەست دیلی‌و زیندان ئەکەن ، هەوارگەیان تەنگەبەرە ، ئاوو هەوای هەڵمژینیان پڕ تەپوتۆزە ، بێ‌ئاوییان پێوە دیارە ، ئەڵێی بێ‌پرسینەوەو بێ چاودێری بوون . ئاکە وا دیارە تۆ حەپست کردوون ، لە تاریکی‌دا فڕێت داون . جا ئەمە بە تۆبال کێ‌دا ئەدەی ، ئارەزووی خۆتە ، بەڵام ڕەنگ‌و بۆی هۆنراوەکانتی زۆر ئاڵۆزاندووە .. گەشی‌ی لەبەربڕیون !

جا ، من لە مەڵبەندی ئەپولۆوە گوڵبەندی هۆنراو ئەبەستم‌و هێز ئەنێمە بەرخۆ ، داوای بەرەڵلاکردنی ئەم داماوانە ئەکەم ! وە زۆر بە تاسەو کوڵەوە تکاتان لێ ئەکەم ، لەم دەست‌بەسەری‌یە پڕ زۆرداری‌یە ، بە هەرچی چۆنێ بێ .. ڕزگاریان کەی ، بەشکم لە پەل‌وپۆی سەرهەڵداوی دوارۆژی بەهرەتانەوە تۆڵەی « دیوانی جوانەمەرگی ڕەنگینتان » بکەنەوە ، ئیتر چاومان چاوەڕێ‌ی بەهرەی هونەرتانەو ..

هەر بژین بۆ ..

برات‌ان
ئیحسان فوئاد
۲۲-۹-۱۹۷۱

**لە نامەیەکدا ...**

● ئەسەر ئارەزووی پڕ لە تاسەی خۆم و خواستی خۆت گەشت و گوزارێکی وردو لەسەرخۆو ئینووم کرد بە باخچە دڵگیرو ڕەنگینەکەتا ، بەڕاستیی و دوور لە هەموو ڕواڵەت و قسەیەکی سەرزارەکی و خاترانە ، لە ڕووی بیرو چۆنیتی دەستپێکردن و بابەت و درێژەپێدان و دەربڕین و کۆتایی پێهێنانی هەڵبەستەکانا بەهرەو سەلیقەی هونەرمەندانەیان تیا بەختکراوە ؛ ئەو بابەتە واقعی‌یانەی کە سرنجی ئێوەیان ڕاکێشاوە شایانی ئەوەن کە لەسەر هەر کۆمەڵێك لەو هەڵبەستانە ؛ یان بگرە لەسەر هەر یەکێك لەوانە ، پیاو چەن تێبینیی و سەرنجێکی پێویست دەربڕێت ، نەك بەم کورت و کوێری‌یەو بە شێوەیەکی گشتی لە چەن دێڕێکی نامەیەکدا هەڵس وکەوتێك بکەین .

● خوێندنەوەو تێگەیشتنی بیرو مەبەستی هەڵبەستەکان ئەوە زۆر باش ئەسەلمێنێ کە بە تواناوە ڕێچکەو ڕێبازی قوتابخانەی واقعیت گرتووە لە دانانی هەڵبەستا ، واقعیەتی نوێی بەرەو ئیشتراکیەت ، ئەو قوتابخانە نوێیەی کە مامۆستا ( گۆران ) بەردی بناغەی داناوەو چەن چینێکی بەرزیشی لەسەر هەڵبەستووە .

● وێنەگرتنی ئەو دیمەنە سامناك و سەمەرانەی کە زمانی هەڵبەستی ئێوەیان پژاندووە لە ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و دەروونی ئەم کۆمەڵەی ئێمەدا ، لەگەڵ پێداگرتن لە کاروباری بیروباوەڕێکی تایبەتی ئاودار بە گیانی پێشکەوتن و

مرۆڤایەتی ؛ بەو سامانی گەنجینەی ووشـــەی جوان جوانی پڕ لە مۆسیقای کوردی پەتی ( کە بە ڕاستی دیوانەکـە لـەم ڕووەوە نێجگار بریقەدارو بە وورشـەیە ) .. شتێکی زۆر بە نرخ و پیرۆزە .

**براتان**

**کاکەی فەللاح**

١٩٦٩-٨-٢٧

## لـه .. مـهمـهوه

چەند رۆژێك لەمەوبەر گۆڤاری ( بەیان )م چەنگ‌کەوت ، کە شیعرەکەتم خوێندەوە « ئەسپی والی » خۆم پێ‌نەگیرا ، هەتا بـۆ جاری دووەم و سێ‌یەمیش خوێندمەوە .. خوێندنەوەی بردمیـە عالەمێك کە عالەمی منە ـ بەراستی ـ ، لەبەرئەوە بەبێ دەسـتی خۆم بڕیارمدا کە ئەم چەند دێرەت بۆ بنووسم لە بریتی پیرۆزبایی ، ئەگەرچی ناتوانم بە هۆیانەوە ئەوەی لـە هەسـتو دەروونمە دەری‌بڕم . وە ئەم هەموو ( انفعالاته )ی شیعرەکە بۆی پەیداکردم لە چوارچیوەی ئەم دێڕانەدا بیخەمەروو !

تەنها ئەوەی زۆر دڵی خۆش کردم ، بڕوایێك بوو کە تۆ لـە مەیـدانی خۆت سستی نانوێنی‌و دواناکەویت ، نەك دواناکـەویت بەشکەم ناوەستی‌و بۆ پێشـەوەش ئەچیت . ئەم شـیعرەت ئەم بڕوایی‌یەمی پتەوکردو چەسپاندی‌و پتر روونی‌کردەوە لەبـەر ئەوە حەقی ئەوەم دایە خۆم کە بەم جۆرە پیرۆزباییت لێ‌بکەم‌و هێشـتا شتی تا لەم بابەتەت لێ چاوەنوار بکەم ، چونکە ئەمە پێویسـتی سەر شانمانە کە لەو مەیدانەدا تەکان بدەین‌و لـە ریزەکانی بـاری بەربەرەکانی‌و مل‌مـلانێ خەبات بکەین بـە هیـوای گۆڕینی بـاری ئەدەبەکەمان‌و هێنانەوەی بۆ سـەر رێگا راستەقینەکەی خۆی .. لە بریتی پالەپەستانێ‌و کەلەکەکردن ، بۆ ئەوەی پێمان لە جێگایێك گیربکەین لەبەر دەرگای ( تەویلەکە !! ) .

زۆرم بێ سەیرە کە ( انسـجە )ی لووتمان ئاڵوزبووە ، جیاوازی نەکەین لە ناوێن بۆنی تەرس‌و گەنی‌و بۆنی گوڵ .. و ڕۆژ زیانی راست ؟!

هەرچۆنێ بێ دڵنیام : ڕۆژان‌و زەبروزەنگیان لووتمان راست ئەکەنەوە .

**محمد مولود ـ مەم**

هەولێر ٢٤-١٢-١٩٦٩

## بۆ : ئافرەتان

تا ووشە هەڵئەگرێ : رۆژباش
تا دێرِ ئەگرێ ووشەی رەنگین
ئەیکەم بە بەند ، بە هۆنراوە
پێشکەشت بێ هەزار رۆژباش
ئەی پەری ، ئەی ئافرەتی باش
ئەی مەردی ژین !



ئەم ژیانەم لا تەواوە
کە لێمانی پیرۆز ئەکەیت
بە دڵداری‌و لاوانەوە ،
بە زەبەندی‌و سۆزی فرەت
ئەی فرشتەی پاك ، ئەی ئافرەت !



ئەی گوڵزاری گوڵ لە وێنەی
ئەستێرەی گەش ،
ئەی دڵی گەرم ، ئەی چاوەکەی

پڕ هەنگوینی خۆشەویستی‌و
لاوانەوەی
ناسك ، بێ‌خەش !
ئەی ڕووناکی بیرو زەین‌و ووردەکاری !
ئەی باسکی ئیش‌زان ، ئەی باوەش !
منی بێ‌بەش
لە بەرامبەر گەورەییتا
ئەی بۆ چاکە « ئەناهیتا »
گولێکم بوو لەم گولزارە
لە درزی ئاسۆی ژیانما خۆی نیشان‌دام ،
نەرمە ئاوازی دلسۆزیی
دلی بە کول‌و پیرۆزی
کەم بۆ لێ‌دام
کەمتر لەناو باوەشی نام .
. . . . . . .
لە تینووەتی‌و بێ‌هێزیما
کانیی « ئەناهیتا » ووشا .
لە لاپەڕەی منالیما
ئازارێکی بەتام نەخشا ،
ئەو ئافرەتەی دایکی ناوبوو و هەموو
ئافرەتانی زەمین
هەلدەگرم لە توێی دلا

لە هەستی بە ئازار تەڕبوو
لە ناو ئەسرین •



ئەی ئافرەتان ، دایکان ، خوشکان
ئەی ئێوە گشت
ئەم گڕو ئەو ڕووناکیەن
سەد پەروانە بەرەو مەنزلی ئێوە یەن
ئەسووتێن ، خۆ ئەدەن بە کوشت !
ئەی سەرچاوەی ڕاستیی پیاو
دروستکەری قارەمانان
ئێوەن کە ئەبەخشن ژیان
بە شاعیران •
وەستایانی ووشەو پاشبەند
• • • • • • •
تا دێر ئەگرێ ووشەی رەنگین
بەندی هۆنراوەی گولگولین
بۆ تۆ رۆژباش •• ووشەی شیرین •

١٩٦١

## بۆ:ماریلین

شووشەی گوڵاو
پیاڵەی بەللوور
ملوانکەی ئەستێرەی ووردی
تێکەڵ بە هەوری قژی خاو
کەلوپەلی کیژۆڵەکەن ، وەکو یاقووت
بە لەشی رووت
چووە ناو ئاو
نەهاتەوە ...
هۆ کیژۆڵە !
هۆ . هۆ . رووبار !
هۆ کیژۆڵە !! ...
هۆ ماریلین !
سەردەمەکەت ئامێرێکی سەوزو سوورە ،
چەرخی بە داوی ئاوریشمو
کەوانەی شەبەنگ پێچراوە ،
وەستاکەی : ئەو ملەستوورە

کەڵبەگری پفدراوە ،
ئاگادارە ،
لە ناو تۆرِین و چێشتخانەو
قومارخانەو سەماخانە
تا بانک و ئیستگەی پاسەکان
تەختەبەندی کارەبایی و
ئاسنبەندی نهۆم نهۆمە بەرزەکان
تا ناو بێشکەو
خەوگای بە پارەو خۆڕایی
شەقامەکان .. بەرمیلەکان
ئاگادارە ، گشت دەبینێ
چەرخی زەمان دەسووڕێنێ
چاکەکارە ، جامی وێسکی تۆ پڕدەکات
خۆشی خوێنی خوێن تاڵەکانی فڕدەکات
هونەرێژو هونەرپیشەو هونەر دۆستە
تۆپە گوڵی ناوقەدی تۆی لە ناو مستە
سەما دەکا .. سەمای پەپوولەی بێ خشپە
چەخماخەی مردن دەخاتە
دڵی دوا دەریانشینی
خوێن بە کڵپە ..
تۆی خۆشدەویست
کە دەی دی تۆ کابانێکی

چێشتی تەمسیل باش لێدەنێ

دەگرێ .. ماچی گەرم دەدەی .. پێدەکەنی

هاواردەکەی .. سۆزی دەروون ژێرپێ دەنێ

جرجی ژیان لەناو بوخچەی

پۆدرەو ئاوازو مەی دەنێ

لەشولاری تۆ خەلاتی

مێگفڕین بوو ..

گیانو دڵو گرژینەوەت

تەمسیلو خەونو سێبەری

لاوخەوێن بوو

بازاڕگەرمی پەردەپۆشیو نواندنە

نە تۆ تۆیو نە من منم

کێشی هەڵبەستی جووت دێڕی

داواو هێنانە تێکدەشکێ

با تێک نەشکێ

با قوربانی ( داواو هێنان ) یان بێ خوشکێ !



هۆ ماریلین !

لە ناو بانیۆی پڕ گولاوو شیرو مەیدا

کەفی سەوزو سوور لە سنگو مەم ئالاوە ..

لەشی بووکە شووشەی دایک

.. باوەشکردوو

وەکو مالێک خەرمانەی داوە .
تیشکێکە .. گڕی لیلای :
ڕۆژنامەو فیلم و گۆڤارو
فۆتوغرافی هەڵایساوە ...
کە گڕ دەگرن
باقە تیشکێك هەڵدەفڕینن
بۆ ئاسمانی پەری‌ی جوانی
لەو سەر تا ئەو سەری دنیا
هەڵی‌دەخەن .. لیکی ئێمەی پێ‌دەڕژێنن .



ڕووناکترین ناو : ماریلین
بەرزی تا بەرزیی گاگارین
لەوسەر تا ئەو سەری دنیا
مووفەڕکی ژوور سەری دنیا
کاتێ لە بانیۆ هاتەدەر
ڕووت وەك یاقووت
تێر لەبەر ئاوێنە دانیشت
دانیشت ، دانیشت
لێکدانەوەی تۆزی لێ‌نیشت
بە ناو مالا گەڕا .. هەلچوو
لەسەر چلی پۆپەی ئاسمان
دانیشت دانیشت

تۆزی لێ نیشت
رازی باوەشێکی گەرمی لا پەنهان بوو
بووکەشووشە نەبوو .. کۆرپەو کۆرپەی
دایکی میهرەبان بوو ..
هەلچوو .. دانیشت ..
لێی راکشا ، لەناو بەفرا لەشی هەتاو .
شووشەی گولاو
پیالەی بەللوور
ملوانکەی ئەستێرەی ووردی
تێکەڵ بە هەوری قژی خاو
دەنگی کپی رووبارێکە ..
هۆ . هۆ .... هۆ هۆ ...
هۆ کیژوولە ....

١٩٦٢ – ١٩٧٤

## ئیش

— ١ —

کوڵمی نەرمی منداڵەکەم
ماچکردو ماڵئاوایم کرد
لە ژنە چاو کەژاڵەکەم
بە پەلە پەل .. بە دەس‌وبرد
دەڕۆم بەرەو باغی هیوا
لە هەورازو لە نشێوا
دەڕۆم‌و چاو دەبڕمە دوور
باغی هیوای پڕ گوڵی سوور
باغی نان‌و پارەو پۆشاك
پارەی شیر بۆ منداڵەکەم
جل‌وبەرگی ژنە دڵ پڕ خەیاڵەکەم .

— ٢ —

ڕێگا دەبڕم
چاو لە ئاسمانی دوور دەبڕم

فرشتەی ڕەش عەبای باڵی
بەسەر پردەکە داداوە ،
کەسی لێ ناپەڕێتەوە !
— سەر نەوی کە .. ئەژنۆ دادە
چمکێکی هەڵدەدرێتەوە .
— ناتەواوە ..
کێ دەڵێ ئاسۆ گیراوە ؟
ئاسۆ دوورە
بەڵام سوورە
لە خۆرەوە پەریی دۆستم
باسکی سپی راکێشاوە
پۆل پۆل کۆتر
هەڵەفڕێنێ
تیشك بۆ ئاسمانی رەش دێنێ
با قەلی رەش نەقڕێنێ
کارژۆڵەکەم .. لە باوەشی دایکی دایە
دەبێ لە دەرگاوە بڵێم :
« پڕ گوانانم شیرە
بن ددانانم گیایە » .

— ٣ —

( باوەڕنامەو رەووشتی چاك ،
تکاکاریی پیرانی پاك )

هەمووی لەناو مقەووایەك
دەێرمە ئەو دیو دەرگای باغ
« باغی هیوام »
بەلکو وەزیرو دەستوپێی
بە دلنەرمی دەڕوانن لێی
بە پەنجەی ناز ، چاوی ئارام
گەشەدەکا ڕووی سکالآم
بەبێ وەلآم ...
.. وا مایەوە ..
بالآم چەما .. چاوەڕوانی نەبڕایەوە .
. . . . . . . . .
برای دوا مێز ١
گەورەی بەڕێز ..
چاوەروانی ، تا بەیانی
دوایی‌نەهات .. دوایی نەهات
وا بوو بە شەو
درەنگ داهات
ئیتر چاوتان ناچێتە خەو
لە دەرگاتان دەدەن دەرگا
پێتان لەقدەکەن ئارامگا
کەی ئەو ساتە بێ بڕوانی
کێ‌ین‌و کێ نین ؟!

دەستوپێ لێن
ڕۆشەنبیرو هەژارالی
گەلین ، گەل چاوەڕوالی
هەلهاتنی ڕۆژێکی گەش
ڕۆلەی ماتی دەس لە کۆش ٠

- ١٩٦٤ -

## دوکانەکەی مام حسێن

بێ با بچین .. بۆ مێوانیی
بەهار شێوەی ناو دوکانی
مام حوسێنی چاوگەشی پیر
روو دڵنیاو ساکارو ژیر ،
کەوا کیسەی بەر پشتێنی دەردەهێنێ
لارەو لار خۆی دێنێ‌و دەبا
تا لە بنی قووڵاییدا ووردەی پارە دەردەهێنێ
دەڕوانێتە دوکانەکەی
یان هێلانەی پڕ ئارامی ژیانەکەی
بێ دەفتەر و قاسە و بار و بارخانەکەی .



وەکو ماستی ناو چێنیی شین
سەرتووی خاوێن
کە لە کۆیە پەلك پەلکە
سپی سپی وەکو هێلکە

خالۆ حسێن
دەرووتێکی وا ساویلکە .
وەك سەوەی پڕ پونگی ئاودار
گەڵامێوی تۆبەرەی دار
سەبەتەی پڕ لە گولەباخ
شەکرەباوی‌و هەموو شتێ زادەی بەهار
دەستەو دیاری بەفراوو شاخ
دڵی من‌و دڵێ خالۆو ناو دوکانی
نەخشانووە ، بە ساکاری‌و میهرەبانی
حەزدەکا کژ هەر بەهار بێ
بەر هەر بەری کردگار بێ



٧ دەستی نەرمت
بخەرە ناو دەستی گەرمم
دڵی گەرمت
بخەرە ناو دڵی نەرمم
دڵ نەرمم رووبەرووی ژیان
کە بۆ خەڵکی پێ‌دەکەنێ
هەروەکو ئەو کیژۆلەیەی
رۆژانەکەی لەناو دەس مام حسێن دەنێ
دەسکێك گولی لێ وەردەگرێ ،
کورێژگەیەك روبعە ماستێك

بۆ بەرچاییو پیرە ژنێ
چەنگێ گەڵامێو دەکرێ •
ئەویش دیاریی منداڵەکان
دەدا بە نان •
خۆزگەم ژیان
هەر سەرچاوەی شادی ئەبوو
هەر ئارامو دادی ئەبوو
بۆ ئەم خەڵکە •• هەموو •• هەموو •

# برسیەتیو جوانی

مندائینه
زۆرم بۆ ووتن ٠٠ بۆ دواجار
چیرۆکم پێ نەما ، ناچار
چیرۆکی ( برسیەتی )ی هەژار
لەگەڵ ( جوانی ) بەستەزمانا
تێکەڵو پێکەڵو بێ بن
بۆتانی ئەکەم قسەچن !

★

( جوانی ) کچێك بوو زۆر نازدار
که بهاتایه لەنجەولار
چ شازادەو پەریزادە ،
چ پەپوولەی باخی بەهار
چ شەماڵی بەفری کۆسار
رێیان نەئەکەوتە شوێنی
جادوویی بالآو لەنجەولار

★

٨ ( جوانی ) کچێك بوو زۆر ڕەنگین
که بهاتایه گفتوگۆ
چ شەکرو شیر یاخۆ هەنگوین
شتی نایابی هیندو چین
نەئەبوون بە وێنەی قسەی
یان نایابیی و خۆشیی چرپەی !



( جوانی ) پێکەنینی گوڵ بوو
سەرتاپا لەشی ناسکی
جۆش‌و گەرموگوڕیی دڵ بوو
شەنگەبیی بسك‌و شابسکی
وورشەدارو شەنگ‌و شل بوو ،
گوڵاو بوو .. ڕووناکی‌و تاو بوو
کچێك بوو ( جوانی ) ناو بوو !



بەڵام . منداڵە ووردەکان
وەکو هەندێ چیرۆکەکان
که شەوانی تر بۆم گوتوون
« که ئاغەیەك ، شازادەیەك
یا سوارێکی هێزو قشوون
لە لای کانی‌یەکی داوێن شاخ

ئەیان دیو ئاوی ئەدانێ
خێرا بە جادووی مەست ئەبوون ،
ئەیان هێنایە بارەگا
بارەگای تێریو پۆشتەبوون
ئەمە نەبوو !
نە هات .. نە چوون !! »

لێرە ئەمڕۆ لە سەردەمێ
کە سەدەی بیستەمە ناوی
لاوێك زەردو دووکەڵاوی
کاسەو کەولی پیرەژنانی
کردۆتە بەرگو پێتاوی
لە خەرمانان
لە کێڵگەکان
لە لای جوتیارە بەندەکان
هاتۆتەوە ، بەد ، تۆزاوی
هاتۆتەوە چی پێ بڵێم ؟
بە مل .. یا بە دڵ شکاوی !

چەن شارو دێ ، چەن کارگەی دی
چەن کاروانو چەند بارگەی دی !

مندالینه
منالی روومەت گولینه :
( برسیەتی ) لاوه بەدەکە
بەو دەستەی کە وەکو دڕکە
روومەتی ( جوانی ) دەقداوە
بێ گیان کەوتوو
بە سەد دڵ پێوەی نووساوە

١٩٦٢

## ســـــاوی

— ئەی دانەری هەڵبەستی خەم
چاو لە دنیا پڕکەو بەستەی
شادی بڵێ ،
با لە ناوتەم
تیشکی ڕۆژی ئارام هەڵێ .

— ئەو دنیایە چەند ئاڵۆزە
ڕەشەبایە .. تەمە .. تۆزە
کە چاومی تیا ئەبەمە خەو ، لێی هەڵئەستم
نازانم چۆن
لێی هەڵئەهێنجم هەڵبەستم ؟

— سەیری مێرگی گیای تەڕ کە
زیوی شەونم تەنیویەتی
بۆچی گیا دێتە سەما
بۆ ڕووناکی‌و بۆ شنەی با ؟

یا ئەو مەلەی دنیایەتی
چلەدارێك ،
پڕ بە گەروو هەلئەکولێنێ
شەپۆل شەپۆل ئاوازی خۆش
کەوا لەگەڵ خوڕەی ئاوا
لەگەڵ شنە شەماڵێکی پڕ گوڵاوا
تێکەڵ دەبێ ، دڵ پڕ لە جۆش
بەستە ئەڵێ
« کێ پێی ئەڵێ بەستە بڵێ ؟! »
دیمەنەکەت هەستداری‌یە
دڵ ئارامی‌و دڵداری‌یە

کێن ئەوانەی بەستە ئەڵێن
دڵداران کێن ؟

ئەو دارانەن لە بەرزەوە
بە لق‌و پۆپی سەوزەوە
وەك دەروێشان ڕائەمێنن
کەم کەم خۆیان ئەهەژێنن
کڕنۆش ئەبەن بۆ ئاوی چەم
ئاوی چەمی خوڕە بە دەم ،
ئەو بەردانەی ناو رووبارن
کە بەردەبازی ڕێبوارن .

ئەی دانەری هۆنراوەی تاڵ
مەناڵێنە ..
بەرەڵلاکە مەلی خەیاڵ
بۆ ئاسمانی پاکی ساماڵ ..

ئاسمان بەرگی پیرۆزەیی سادەو شینە
پڕ بە دلی باوەش ئەگرێ
لەم دنیایە بەر بەرینە ...

بە هەوایەك بۆنی خۆشی تێکەڵاوە
زیکەو جووکەو شنەشنی پێدراوە
هەڵاوەی ئاو
کە پڕشنگی
هەمەرەنگی
سەر قەڵبەزان تێی ئاڵاوە :
فێنکایەتی بەفری لوتکەی
بەهاران کە ئەتوێتەوە
ناوچەوانی گەرمت تەڕ کە
تەڕکە با فێنکی بێتەوە ،
دلی کرژت بکرێتەوە .

# بەرەو پاییز

— ١ —

که بەهار بوو
خەیاڵی وەك ئاسمانی شین ، مێرگی دەشتان
ساف‌و مەست‌و گوڵاودار بوو ..
که بەهار بوو
جوانە ئاسکی دەشت‌و دەری
پڕ لە گوڵی پرشنگدار بوو
دڵی لەگەڵ کانی‌یەکاندا
نەی گورانی‌ی کردگار بوو
که بەهار بوو : هی تەمەنی تەڕیی گوڵێ
که دڵداری لە دەروونیا هەڵ ئەکوڵێ
تیشك‌و سیحرو بەزم‌و جۆش بوو
بۆی گوڵاوو خەونی خۆش بوو .
. . . . . . . . .
کێ راوکەر بوو بێتە راوی ؟

ئەگەر راوکەر لە دوا ھەوریش بوایە داوی ،
نە دەھاتە ڕای گومبەتەی تەلیسماوی !
کە تەمەنی بەھاری بوو
لە سروشتا خۆی دیاری بوو
خۆی بەھاری سەد بەھار بوو
ھەر ئەو رازی کردگار بوو ٩٠

★ ★ ★

نەك بڵێی کە ئاسکەی بەھار
گۆشەگیر بوو ، دوور بوو لە شار
لە دڵداری لالووت بوو بێ
گێتی لە لا نابووت بوو بێ !
نەخێر .. نەخێر !
گوڵزار نەبوو گوڵی نەبێ
بەڵکو شای سەر چڵی نەبێ ،
٩- کۆڕی یاران لە تای شەوا
لەبەر تافی مانگەشەوا
بە گفتوگۆی جادووی نازی بەجۆش ئەبوو
بەزم ھێندەی تر خۆش ئەبوو .
گەڕێ لە ھەر رەشبەڵەکێ ،
بە پێکەنین .. بە چاوبڕکێ ،
بەو پرشنگە ئارام رەنگەی
کەوا لە دوو چاوی ئەتکێ

که تینووەتی دڵی هەزار
هەرزەکاری لێوە ئەشکێ !
بە نەخشینیو نازو کردار
شائەندامی بەزمی یانەی دڵداران بوو
لەسەر دینو روو لە قیبلەی دڵداران بوو ٪

٭ ٭ ٭

تا رۆژێ هات
سا رێکەوت بوو ؟ • خەوی خاو بوو ؟
خۆیو دڵە گەوهەرەکەی
کانە تیشك هێنەرەکەی
— ناڵێم کوتاڵ یان پاتاڵی
سەر دوکانی کڕیاران بوو
چونکە دڵێك پڕ بە مانا ، دڵ بوو ، جوان بوو —
تەلیسم بوو ، یاخۆ داو بوو
دڵی ئاسکەکێوی راو بوو ••
کاتی بەهار
دنیای بەهار
ئاواتی تاسەری بەهار •

— ٢ —

بەڵام پاییز
لە مووی سپیی بە دەگمەنا
لەگەڵ تاپۆی چەند لۆچی کەم

له روومەت‌و له گەردەنا
کەوتەخۆ بۆ نواندنی فیز
«ئاخ که پاییز پێی نەدەنا
تەنیا بەهار جلوەی‌دەکرد له گولشەنا ،
له تەمەنا !»
بەڵام پاییز لافاوی زەرد
دائەگرێ گشت گولزارو هەرد !

هەی داخەکەم بۆ ئەندامێ
هەر بەهاری جوان ئەفامێ !
خۆری پاییز وا پرشنگی
له ژێر تارای هەوری بۆرا
له گۆمی دوو چاوی مەنگی
گڕی ئەسرین پەخشان‌ئەکا
بە بێ دەنگی ،
ئەڵێی بناشت لەگەڵ بەختی ئاسمان ئەکا
سکاڵای روو لەیلاخەکان
هەتیوماوی ناو باخەکان
پێش‌کەش دلی زەمان ئەکا .

— ٣ —

دیارە جوانی ، یا بەهرەیە یا هونەرە
لای خانمێ کەوا دلی بەهارێکی تازەو تەڕە

مل كه‌چ ناكات بۆ هیچ كژێ
ئه‌گه‌ر بۆنی ده‌سته‌ڵاتی لێ‌هه‌ڵمژێ
بلێم به‌چی ؟
به‌ هه‌ر گه‌ردێ له‌ له‌شێكا نه‌رم‌و نیان
وه‌كو به‌یان
بلێم به‌چی ؟ به‌ هه‌ر كونجێ كه‌ بیگاتێ
ده‌ستی خه‌یاڵ
سا بێ‌گومان ، ئه‌و دیمه‌نه‌ت قه‌ت ناداتێ
گوایا ئه‌م ساڵ
به‌سه‌ریا زاڵ ئه‌بێ پاییز
نه‌خێر هه‌رگیز
رێ داناگرێ به‌ره‌و پاییز .

— ٤ —

هه‌رچه‌ند به‌ره‌و پاییز ده‌چین ، وا ئه‌بینم
به‌ڵام دڵی به‌هره‌داری تۆ ناشكێنم
تۆم خۆش‌ئه‌وێ
هه‌ی له‌ گیانی منت‌كه‌وێ
تۆم لا جوانه
گوڵ هه‌نارم له‌ لا جوانه
چونكه‌ له‌ به‌رد نادا لووتی
تا به‌هاره‌ سووراوی جوان ئه‌پرژێنێ

لێوی ئاڵی دڵنیایی ئەسروێنێ
له پاییزدا
بوخچەی پوختی پڕ یاقووتی
سەد گوڵناری تر ئەڕوێنێ
هەر بەهاری تەڕ ئەنوێنێ .

١٩٦٤

# دارســـــتان

## — ١ —

کانی‌یەك بوو ، دوو چلی داری سەوز
مانگ بەسەریانا بە ڕووی زیوینی کاڵ
وەك منال
پێ‌هەڵگەڕا ، کەم کەم ، هەتا رووی پڕ وەنەوز
بوو بە سینی‌ی ئاگرینی ناو حەوز •

تاکو ئەڕوانی سەوز ، سەوزێکی تۆخ
نەونەمامی مێوو سێوو داری خۆخ
دیمەنێك بوو دەستی رەنگینی سروشت
وەك هەموو جوانێك تیا بەهرەی ئەڕشت :ـ

نەرمە گیا سەوزی هەموو وەرزی بەهار
قەیفە بە بریقەی گەڵای پۆپو چلی ئاسمانی دار
ڕاوگە بوو بۆ خەرمەنی ئەستێرەکان ••
هەڵپژانی گوڵ ، گوڵی ئەستێرەکان ••

هەروەکو ماسی گەلی ئەستێرەکان ٠
خۆی ژیان بوو
خۆی گوڕو گەرمی دەری لاشەی ژیان بوو
تێکەڵی کات بوو ، کە کات تێکەڵ گیان بوو
ژینی ساکار
تازە گوڵزار
واتە دارستانی زوو ٠

— ٢ —

بلوێرژەنی ماڵی پاشا
کچی پاشاو بەگزادەو شا
بەجۆش دێنێ
سا گشتیان هەڵئەپەڕێنێ !
کاتێ ئاهەنگ چڵئەکا مەی لە تەماشا
بەرد ئەدوێنێ ٠٠
لە چۆلێکی ساردوسڕا ڕائەمێنێ ٠

— ٣ —

کاکی بلوێرژەن بژەن !!
یا هەڵیکرد ٠٠ بارەشێکی قورس‌و تار ،
زەنگی تۆقانی تەقان
ئاگری هێنا بە ژوورا تا خوار ٠
هێرشی لافاوی سوورو زەردی دڕ

گۆمی گەرمای دۆزەخی شێتی شەقان
ڕادرا بۆ ناو چەپاوی ئاگرو کلپەی بە گڕ :
( داخەکەم ـ بالآی نەمامی شەنگی دار
گیانەکەم ـ سروەی شەمالی مەستی پار
هۆشەکەم ـ سەوزایی زادەی نەوبەهار
چاوەکەم ـ کانیی زولاَلی وورشەدار
ئاگرێکە و باوەشی گیرکرد لە دارستانەکە
چی‌بکا ئەیکا ، کەسێ نالێ مەکە !

— ٤ —

پەپوولەکەی شەوی بێ‌دڵ
باڵ ئەکا بە نووکی چقل
لە ئاگرا فرسەت دێنێ
هەتا گیانی ئەسووتێنێ .

— ٥ —

چاو ئەگێڕم ، کوانێ دارستانەکەم ؟
ـ جێی خەیالی بەربەرەللاو لانەکەم ؟ ـ
دارکەران ، کەی چوونو تێی‌بەربوون بە قینی
تەورو پاچ ؟
تێك‌شکا ، وەك مەردمی بێ دەست‌و قاچ
وا هەموو برژانگەکانم داری دارستانەکەن
مەمکی پێ‌شۆڕبۆتەوە ،

سمتو ڕانی تێ ڕواوە ،
قژ ، گژوگیای پەستو ئالۆزاوە ، لاو -
لاوە ، ترێمارانە دەوری گشتی داوە .
جۆگە خوێناوی ژنانەو کێمی سەر
کاسەی هەژاوە .

شەو ، هەموو شەو
گەر بە دەگمەن تاکە ئەستێرەی بەیانی دەرکەوێ
خۆی لە کێلگەی سمتو ڕانو قاچو پێ
ئەگرێتەوە ..
تیشکی تەڕ بوو - وی بە مەمکی سەر لقان
ئەسڕێتەوە ،
ڕائەکا ، کاتێ کە دێوێك روو لە دارستان ئەکا
گەر بگا دەستی ، زەویشو ئاسمان وێران‌ئەکا
هەڵئەقرتێنێ سەری خونچەی مەمك
ژێری پێستی سنگو ڕان ، بازوو و مەچەك
هەڵئەلووشێ ، خوێنو کێم ئەخواتەوە ،
سا بە مووی پەرچەم دەمی ئەسڕێتەوە
تا دەمی بۆنی گوڵو سەوزایی لێ‌ئەڕواتەوە
ئارەزووی خواردن لە دڵیا ئاگری ئەبڕێتەوە
کۆچ ئەکا ! سەد جار ئەژیو ئەمرێتەوە .

— ٦ —

سەد جار ماڵی پاشا بڕمێ
نە سەمای ما نە ئاوازی ،
کەللەم ئەسمێ
چاوەندازی
دارستانی ، لانەی خەمو لانەوازیی

— ٧ —

چونکە بێگانەم .. لە میحرابی کەساسی نوێژئەکەم !
حەز بکەم یا حەز نەکەم بەم وێنە وا خۆم گێژ ئەکەم
چونکە خەڵکی جەنگەڵی سووتاوو شێواوم ؟ بەڵام
ئێوە کێن ؟ ئەی خەڵکەکەی پرسیاری ووشکی بێ وەڵام !
ئایا وێڵی دەشتی خوێی بەر ئاگری خۆر بم ، کەوا
قەوزەیەك ، یان سێبەرێك نەرمی نەبێ
چاوەکەم تەڕکاتەوە ، چاوم ئەوا
دائەڕووشێنێ بریقەی ئاگرێك داناکەوێ
چی‌کە کەللەم جەنگەڵی ، پڕ دووکەڵی
تاریك‌و مات
ناتوانێ هەڵگرێ ! تاکەی ؟ کوانێ رۆژهەڵات ؟

— ٨ —

ئەی ئەندێشەو خەیاڵی تەڕ
لە جەنگەلا وا دێمەدەر

شوێنێکم بۆ بسازێنە
کە بەهارو باخو ئاو بێ
کۆلیتێکی لەبەر چاو بێ
نەك تەلاری پڕ ئاوێنە •

— ٩ —

تا بلێم : گۆرانیی بالاّی شەنگی دار
گیانەکەم سروەی شەمالی مەستی یار
چاوەکەم کانیی زولالی وورشەدار
هۆشەکەم سەوزایی زادەی نەوبەهار
بێن گولاّودار بن لە دارستانی خەو
تاکو دانیشم لە ڕۆخ کانیو تریفەی مانگەشەو •

١٩٦٥

## دەستار هاڕ

با کوڕەت بێ ،
دنیا ماتە ، شەو بێدەنگەو شاری دوور
خەواڵووەو ووڕ ماوە !
پەردەکانی شەماڵ دەیان لەرزێنێ
وا تاریکی چۆکی لەسەر سنگ ناوە !
هەر کوڕەی تۆ ، هەر نەڕەی تۆ دەمێنێ ،
هەتا لەناو گۆزەو کەندووی خورێندا
لەناو خانووی کەلاوەدا ، بخوێنێ :
گۆرانی‌یەك ـ وێڵو بێکەس ـ
دوور وولاتی بنوێنێ !



بقیژێنە ، لە بێدەنگی‌ی بێشوێنا
کە دایکەکەی ڕزی لەناو نوینا
یا ئەو خوشکەو ئەو دولبەرەی بەتەنیان
کەزیی لوولیان هێند هۆندەوە وا بۆزە ،

چاویان ، حەوشەو دەرگای مالیان ، چیاکان
ئەو......ی کە خنکاوی ناو تۆزە
چاوەڕوانی گێژی کردن بۆ ڕۆژێك
کەوا دەڵێن ئێجگار گەش و پیرۆزە



با کۆرەت بێ ، ئەی ئەسپەکەی بێ سوار
خۆ ناتوانی زنجیری پێ بپسێنی
زین پێوشیت .... بکەی بەلادا
بتجۆشێنێ گوڕی غارو بێیتە غار
بە سم مەیدان بشێلیت و بشکێنیت ،
تۆزی مەیدان ، بخنکێنێ ئاسمان
لەژێر تۆزو تەم و مژدا مردووان
بە دلی پڕ لە داخەوە هەستێنیت
تا هاواری ئاواتمان
وەبەر گوێچکەی نووستواندا بخوێنیت .



وا مانگی خڕ ، لە سەرەوە دەڕوانێ
پڕ بە دڵ و پڕ لە پرس دەڕوانێ
کە رازێکە ، ڕەنگبێ - بێشک - دەیزانێ .
ئەو نەیزانێ لەسەر ڕا کەس نایزانێ .



با دووراو دوور •• ناوناویش بێ دەنگت بێ
بۆ لای مانگی بە پرسیار
بۆ پاڵ شاخ‌و دارگوێزەکەی خەیاڵدار :
کە سێبەری وەك تارمایی رادەکشێ
بۆ کۆڵێتە بەردینەکەو بۆ دەوار •



ئەی ئەسپەکەی بێ سوار
با دووراو دوور ، ناو ناویش بێ ، دەنگت بێ
هەر کوڕەی تۆ
بلەرزێنێ دەواری رەش جار بە جار :ـ
دەوارێك‌و بەربەیانیی ئێجگار زوو
*« خاتوزین »و دەستاڕێك‌و دوو بازوو
ئەڵێی چەرخی زەمانەیە دەستاڕی
کە چۆن ژین‌و ڕەقیی زەمان دەهاڕێ
بەڕوو بۆ نان ••
ئەگەر نەبوو بەردو گاڵ‌و هەرزن بۆ نان
بۆ ژین‌و مان دەهاڕێ •
با بهاڕێ ، نەوەستێ
دێوی زەمان لە راکشانا هەڵئەستێ

کات لە دۆڵو لە نشێوا
لە قەد کێوا تا لوتکەی بەرز
لە گەڕ دایەو ئەسووڕێنێ دەستاڕی وەرز •
چاوەڕوان کراو
ئازیز تر لە گلێنەی چاو
هەر دێتەوە •••
بەیاری ووشک •• کێوی برژاو
وەك ئەتڵەس ئەگەشێتەوە •

لەئاسمانی فەلەستیندا :

## ئەستێرەی کز

نە شەوە شەوێکی هیوا کوژ
نە رۆژە ، رۆژێکی خنکاوی تەمومژ !
ئایا کات وەکو من گیراوە هەنگاوی ؟
یا خۆ من بێ ئاگام لە چزووی
ئازاری تەماوی ؟!



ئەی رەشی وەك قاوەو مێخەکی
پەرچەمی شەوی تار ،
لەش‌ولار
بە ژیلەی ئەستێرەی دوورو کز
نەخش بوو
شەماڵێ لە تۆوە قووڵو مەست
نەك ماتی ، بۆی ئارام بیژێنێ ،

تا تامی شەوی رەش بچێژم
لە جەرگی شەوەوە ئاخی دڵ بنێژم ،
بە خەوی بەیانی
لێی جۆشدەم گۆرانی :
« .. وا کچی رۆژی سوور
لە جۆگای زەنگوڵو کانیی روون
دەشواتن ، تاڵی مووی درێژو جوانی ،
مزگێنی ( بەیانی )
بە شاخو دەشتو دەر وەر دەبێ
( دێ ) کەمان لە خەوا هەڵئەستێ :
کوڕ کاڵەو گۆرەویو پشتێنی ئەبەستێ
کچ بازووی هەڵئەکاو ناوەستێ .

خۆشترین سبەینە ئەوسایە
کە شەومان دەیجوورو درێژ بێ
ئەو کەسەی لەگەڵ شەو ڕانایە
سا مەگەر نەخۆش بێ ، یا گێژ بێ .
چەند خۆشە کەڵەشێر بانگ‌بداو
هاواری راپەڕین بۆ نوێژ بێ » .

بەیانە ؟ . نەء . خەونە ، یان بیری باووبژ ؟
ئەی شەوە شەوێکی هیوا کوژ ؟
یا رۆژە ، رۆژێکی خنکاوی تەموژ ؟!

گەر ڕۆژە ، ئەی بۆچی باخی پیر وا کزە
بێ تیشكو شەماڵو گوڵاوە ؟
وەك شەختە مەیوە لە لێوی گوڵ : بزە .
زیندانەو وەك ڕۆژی خەوێکی شێواوە .

گەر ڕۆژە ، کوا وەك دێو گەردەلوول
هەڵبکات .. تێكبدات .. بڕمێنێ
دنیای مات لە خەوا بخاتە جموجوول
بۆشایی تاریككات ، دایگرێ پێچولوول ،
لەپاشان : پاش قینی شۆرشی ..
پاش نرکەی هەوری بۆر ،
بارانو بارەشی
ئاسمانی سافی شین جوان وەکو پیرۆزە
سێبەرکا بە باڵی لەم خاکە پیرۆزە .
١٩٦٤

**مەیدانخوازیی زایۆنیزم**

## گیران

سێ کەس .. سێ دەمانچەی چڵکن ،
سێ باوەشی رەقی دوژمن ،
سێ باڵ ـ باڵی واشەی ئاسن :
چۆلەکە گەنم رەنگەکە
گیرا ، گیرا ،
پەلی کوتا ، چاوی گێڕا ،
باڵەفڕکەی ، گۆمی دەنگی
راوکەرانی رەشی هەژان .
چاوی گێڕا
بەڵام بێ سوود بوو ، بێ‌گومان
هێزی دڵی راوکەرەکان
وەک تاریکیی زیندانەکان ،
هێزی ماخولیاو دەبەنگی

بە هیچ جۆر نەخێورایەوە ...
چۆلەکەکە کپ بوو دەنگی
کلی ترسی زیندانەکان
ڕژایە ناو بریقەی چاوی
دندووکی کزو خەماوی
جومکردە ناو پەڕی سنگی
بردیان - خۆیو نیشتمانی
باوەڕو پیرۆزەکانی
شوورایەوە بە هێلنجی دەروونیان
دەروونی لەرزۆکو سادەو زەبوونییان -
بردیان .. بە هەراو سام ، شەو بوو
دیتیان چوو
بەلآم بۆ کوێ چوو ؟
بۆ زیندانی تاریکیان
نێچیرەکەی هەر سێکییان
دیارە راویان سەرکەوتوو بوو !



هێلنج ..
قەپو ڕنەی شێتییان ،
خولیای کێویو دێوو درنج ،
بێ نرخییان .. کە پشووی دا و مەلەی هێمن
کە بە بێدەنگی دەیکوشتن !

بوو بە توانا
بەیدارێکی بێ نسوود نا ،
وا لە ئاسمانی شەرەفا
هەڵۆیە .. شاهێنە .. بازە ،
گیانی بەرزی
بەسەر تیشکی گەلاوێژا
لە ژوور هەورا لە پەروازە .

سپارتاکۆس
نەك لە شەوی ڕۆمای قورسا
لە لەشی چۆلەکەیەکدا کە دەترسا
هەڵسایەوە !
نەبەزین لەناو دوو چاوی
بچووکی شەوقیدایەوە .
گاڵتەی دێ بە هێزو سووکیی
واشەی دوژمن ،
دەس‌و دەم‌و چەکی چلکن ،
تەنانەت : زیندان‌و مردن .

١٩٦٢

# دەست وەشانێك

# لە قودسەوە

هەرچەند شەقام وەك دێی چۆلە
بێ‌هەست‌و سڕ راکشاوە ،
بانگت دەکا « دەنگی تۆلە » :
ڕێگای مەردیی نەگیراوە .
هەنگاو نانی ڕێبوارەکان
وەك مس قورس‌و شلەژاوە ...
وادێن !؟ چاویان تێ‌بڕیوی
نەشت‌کوژن . بۆ کوێ دەچی ؟
پەڕۆی کۆن‌و داڕزیوی ؟

★ ★

خوێنی دڵی ساردوسڕت با گڕبگرێ
وا سەرشۆڕی ڕێگات دەبڕێ ..

★ ★

وادێن .. وا .. دێن .. دەتخزێن بە چاو
گەرماوی ڕووی زەردی تکاو
تاکەی تاکەی دەگوشن دڵت ؟
وابوون ، وابوون .. دەستەو ملت !



شەقام هەرچەند خۆ چۆڵ نی‌یە
ڕێبوارانی بێ سەر دەڕۆن
کەی لە کارو کردەوەی تۆن ؟
دەسی ڕەق‌و بروسکەی دەم خەنجەرەکەت
بە پەنجەی قین دەرگای دڵت دەکاتەوە
لێیدە . دەستت بووەشێنە .
رامەمێنە .
لێی‌دەو بڕۆ . با بڕوانێ
ئاوڕت لێبداتەوە ؟!
وا تیغەکەت لەناو دڵیا
ئاگری قین دەکاتەوە ..
با ئاوڕت لێ بداتەوە
با ئاوڕت لێ بداتەوە ..



شاری گەورە تا دێ بچووك دەبێتەوە
داری چرا دێن ، ڕوو بە رووت

پێچی کوڵان دەگرێتە خۆی
لەشی ماندووت ..
کاسی زرمەی نارنجۆکو
بۆنی barووت
لەم کوڵانەو ئەو ناو پاسو تا ئەو شەقام
ئەژنۆی بێهێز هەڵتدەگرێ
دەچی .. بۆ کوێ ؟
لە دەرگا دە ـ ماڵی هاوڕێ :ـ
— کێیە ؟ .
— منم .. مەپرسە کێم
نیشانم دە بۆ شەوێك جێم !

★ ★

زۆر زۆر ئەمشەو جێگەیان بۆ کردیتەوە
بە نیگای چاو ،
بە گوڵی رووی خوێن تیا نەماو ،
تۆ و دەسو خەنجەرەکەت
کە خوێنی لێ دەتکێتەوە
ناتوانن قەت بشارنەوە
ئەچی بۆ کوێ ؟
شاری گەورە تا دێ بچووك دەبێتەوە
تا دێ .. بچووك .. دەبێتەوە .
نە رۆژنامەو رێبوارانی شاری تەمین

نه یارەکەی دوا پەنجەرەی چاوەڕوانی
هەتا دایکی پەستو خەمگین
کەس لانەکەت پێ نازانێ
کەس باس‌ناکا ( تاوانەکەت ! )
دەس‌وەشانە مەردانەکەت •

* * *

ئەوەی خۆی لێ مەڵاس داوی
جەهەندەمی بۆ تاو داوی
نەك ئێستا بەڵکو لەوساوە کە وەرگەڕان
( فەلەستینیان ) بە دووکەڵی ستەم خنکان
لەوساوە ، کە ڕۆڵەی گەلی ، تیکۆشەری
تاوانباریت •• گیانت بۆ هەر کوێیەك بەری •
شاری ( قودسی ) ناو دەروونو خەنجەرەکەو دەفتەرەکەت
شاری گەورە وا کەوتۆتە ژێر باڵی شەو
تا بەیانی •• خۆتـو دەس‌و خەنجەرەکەت
ئەگەر چاوتان بچێتە خەو
تا بەیانی •• رۆژێکی نەو •

## ئەسپی والی

شێخی گەورە کەوتە پەلە ،
مجێوورو کەوش چنو پیرەمێردی
مزگەوتەکەی بە دوایەوە ،
ـ لچکی کەوای هەڵنایەوە ـ
ملی نا بۆ پلەی تەنگی منارەکە
پلە .. پلە
پشووی هەڵما ، هەر ملی ناو نەبڕایەوە
تا لە سەرووی منارەوە
بانگدێری ناردە خوارەوە
کەوتە بۆڕەی شینو هاوار
ستایشو ووتەی بەکار
کە ئایاتی جوان ئەخوێنێ :
« هەزار رەحمەت ئەبارێنێ »



٦

گۆڕەپانی بەردەم مالی
شکۆداری گەورەی والی
لێواولێوی ئازیزانە ••
جێگای رەزمی سوارچاکانە !
لە هەر لایێ :
کەڵەك کەڵەك
فەقیانە شۆڕ وەستاون ، وەك
چاوەنۆڕی فەرمانی زل
سەرکزۆڵو تێكشکاو مل •
بۆڕیە ژەنو دەهۆڵ بە شان
گەرمن ئەمڕۆ ،
ئەنالێنن : بە ئاوازی پیرە شەیتان !
ئەقیژێنن : بە هاواری بنی گیرفان !
ئەجۆشێنن •• غەڵبەو دەنگو رەنگی مەیدان :
« هەی شیوەنو هەی باوکەڕۆ
هەی مردووی ناز ، رەحمەت بۆ تۆ »



وەزیری راست •• وەزیری چەپ
دەفتەردارو خەزێنەدار
لەگەڵ دەستەی نووسەرانا
بەناو خەڵکی چاوەروانا
رێیان بڕی ،

ڕایان خوڕی :
ده رابگرن ویقەو زیقانو تەپەتەپ •



لەم کاتەدا ، پاشای والی هاتە تەلار •
هات بە چاوی بە خەوەوە ،
بە جلوبەرگی شەوەوە
چاوی شێتی تێك هەڵسووڕاند
بە خەندە ، گاه بە واقوڕمان
نەڕاندیو بۆ ماڵەوە چوو •
ووشەکانی - ئەگەرچی کەس گوێی لێنەبوو -
بەمانای باش لێدرایەوە
ماناکەش دەنگی دایەوە !!



کێ پیرۆزو زۆر گەورەیە
شوێنی بەردەم « تەویلە »یە
بەختیارەو خۆی هەڵئەدا
تا دانەبڕێ لە دەرفەتدا •
هاتن •• خەڵکی نیشان بە شان ،
وورگ زلو فەقیانە شۆڕ ،
سەرو مشکی توولینەی نان ••
هێنایانە دەرێ لاشەی - جوانەمەرگ -

ئەسپی والی
دەس نەئەکەوت ، سنگی ، یاڵی
ملی ، قاچو قولو باڵی •

— ٢ —

بەڵام والی بـۆ خۆی کـە مرد
کەس نەیزانی بۆ کوێیان برد •

١٩٦٦

## مەرگو منداڵ

لە ئێرینەی شەپۆلێکدا ،
بەسەر خوێناوی رێگادا
شوێنی پێی بە جێ مابوو ٠
لە شەختەی ساردی چۆلێکدا
بە تەنیا بوو ،
دڵی سەد جار لە ژێر دەستاڕی ترسا هەڵ ـ
گلۆفا بوو ،
منالێك بوو : گوڵی رووی سووری ژاکابوو ٠



بە تەنیا چۆن منالێك روو بە رووی غولێك ،
شەپۆلێکو دڕندەی جەنگەلێك ، چۆلێك
بووەستێ ؟ بێ تکا شەڕکا ؟
بە کام نینۆکو بازوو و قۆڵ
بە کام چەك روو لە سەنگەر کا ؟
مەگەر فرمێسکی قورسی ناو

گەرووی خنکاوی پڕ ترسی !



مەگەر پەنجەی بەسەریەکدا –
لکاوی گەرمی گیرفانی ؟!
بە هاوارو بە گریانی
ڕەوایە ؟ کام دڵی کام مەردە دەتوانێ
منالێك ڕوو بە ڕووی مردن بجەنگێنێ
کەوا مردن فڕوفێڵی :
« دڵو سۆزی منالێتی ،
وەیا خۆ خۆشەویستی دایکی » نازانێ
بەرامبەر تاکە منداڵێك
دووا هێزو دوواقین خۆی دەسازێنێ
لەناو کەلبەی بەسامدا گڕ دەبارێنێ
بەبێ ڕەحمانە ئەیشێلێتو ئەمرێنێ •



منالێك وا ملی وەك چەپکە گوڵ
ئاسن بە سەریا هات ،
ڕەشی‌ی مەرگ‌و خوێنی سوورو ئەستێرەی
گەشی گیانی
لە لاشەی ناسکی ـ کانی
پژا •• ڕەنگینی کرد دنیای خەماوی‌و مات

١٩٦٦

# مردنی جوان ٩٠

خەوبینینی منالّی‌یە یادگارت
روخساری سوور هەڵگەڕاوو کانی چاوی
پڕ ژیان‌و میهرەبانی‌و پڕ ئازارت
لە گلێنەی دوو چاوما
سێبەرێکە
رابردوومە ،
یادی خەم‌و دڵشکاوی منالّیمە
یادی سۆزی وون‌کردوومە
یادی گەرمی فرمێسکێکی گەرموگوڕە :
« ئەڕۆم .. ئەڕۆم
بەناو دەریای زۆربەرینا
بۆگوڵزاری ( لاوانەوە )
بۆ باوەشی دایکێکی شاد
لە هۆشیاری‌و خەوبینینا

که لاڕووم بە ڕوو دا بێنێ
بۆم بڕژێنێ
زەردەخەنەی مرواری سەوز
تا بچێژم خۆشەویستی تێکەڵ شیرو
خۆشیو وەنەوز ،
. . . . . .
لەم باخەدا بە هەڵبەزین ،
بە ڕاکردن ، بە پێکەنین ،
لە پڕ خۆم بۆ سنگی گەرمی باوێم بەهێز ،
ئەویش نازی دایکێتیم لێ بکا بە قین
بەڵام قینی دایکێتیی سەوز »

★ ★

لە بەردەممای وا وەستاوی ،
ئای چەند پاکی ، وەك ئاوریشمی سپی ، خاوی ..
ئا ئەمەتا دانەکانت .. ئەمە لێوی زۆر تەنکت
ئا .. ئەمە چاو دوو ئەستێرەی درەوشاوەن
وا ئەتبینم بە تەواوی .
هەتا ئەمە پرشنگی دوو کوڵمی تۆیە
ئەڵێی رۆژی هەڵهاتووە
قەنەوزەکەی تەڕ کردووە نەرمە بارانی ئێوارە ،

ئەمە خەندەی گەرمی تۆیە
گوڵە باخی پشکووتوە
لەرەی نەغمەی دوڵبەرێکی زۆر نازدارە
دایکە وا تۆی راوەستاوی
تۆم لێ دیاری •



چاوم پڕ تیشکی تاسەیە
بە وێنەکەت گەشاوەیە
دڵۆپێ شەونمی ئەسرینی تاسەو خۆشی
نەک رووناکی وێنەکەتم لێداپۆشێ
دڵ خۆم ئەگوشم ،
پەخشان ئەکەم :
خۆشەویستیو هەستی خۆشی ،
یادگاری پڕ لە خۆشی
زیاتر دڵۆپی شووشەی ئەسرین
هەڵ ئەکولێ لەناو چاوا
لەژێر پێڵووی راوەستاوا
دێتو دەخزێ
کانی دەزێ ••
وێنەکەی تۆ پڕ بە چاوم پرشنگدارە ،
پێڵوو مەستو چاوەنوارە ••
کە لێکمدا چاو ـ بۆ تروو کان ـ

بەسەر وێنەتم‌دا تروو‌کان
ئای نەمزانی •• وێنەت وون بوو !
سێبەرێك بوو •• دایکی شیرین •



هەڵت‌دەگرم لە ئەسرین‌دا
لە تەنیایی‌و نائومێدیی کۆڕی ژین‌دا •
خەونی شادیم ••
مایەی بوون‌و هاتوچوونم
بۆن خۆش کەری هەست‌و هۆشم
هەڵت‌دەگرم لە تویی دڵی زۆر بە جۆشم
هەر منالێك کە لە جەژنا بگری منم
هەر ئافرەتێك بە دڵسۆزی پێ‌بکەنێ
وێنەکەی تۆی تیا ئەبینم ••

# شیوەنێکی بێناو بۆ دیوانەکەم

نەمردوو مردو مردوو مایەوە
مەرگێك بە جۆرێك دەنگی دایەوە

دەهۆڵی دۆڵو ئەشکەوتی گیانم
هەژاو دووبارە هاژەی نایەوە !

کاکڵ کە سووتا ، تۆکڵ بۆچییە
چۆن لەناو چەندا نەئەتوایەوە ؟

ئەو تیشکەی رەنگی ژینی دەبەخشی
نە رەنگ ما ، نە سەنگ..کە کوژایەوە.

سەرم سوڕماوە بۆ ئەو شمشاڵەی
کەڕووی هەڵهێنا داڕزایەوە

ئەو نەبوو دایکی ئاوازی وونبوو ؟
بۆ چ ئاوازی کەی لێنەدایەوە ؟

دیارە نەمر بوو ، بۆیە باوکەکەی
لە پاش مردنی ( نەمێرد ) مایەوە !

زەوی نـەزۆك بوو و کـانی ئەســتێور
پاش ئـەو بـۆ گولێك هـەر نـەزایـەوە

من ئەمرم ، ئەمرم .. ئەمرۆ بێ‌و سـبەی
چـاوم نامـرێ قـەت لــە دوایـەوە

خۆزگەم هـەر یەك جار چاوم بـە چاوی
کۆرپـە جوانـەکـەم بکەوتـایـەوە !

خۆلەمێشەکەم بـە فرمێســکی چاو
ئەشــێلا ! ئـەگــەر بهـاتـایـەوە

تەنیا هەر ساتێك ـ خۆزگەم ـ گولەکەی
بـۆ دلی زامـدار ئەگەشــایەوە

تـا یـادگـاری تێری دەکــــردم
ســەری کـاس کردووم بەرئەدایەوە

١٩٦٦

# سەماکەرو سەماکەری مردن

— ١ —

ڕووناکی‌ی سەر شانۆو ئاوازی گەرموگوڕ
شاباشی هاتنی فریشتەی سـەمانە
تاریکی‌ی بۆشایی‌و بێ‌دەنگی‌ی ساردوسڕ
بۆ مردن سەماگای نەدیوو پەنهانە
هەنگاوی ناسکی شادی‌یە ؛ هونەرە ؛
( مردنیش پێی قورسی بەسامو گرانە )
هەر لەرەی ئەندامی وورشەیەو ئاوازە
پۆشاکی تەنکی لێواری ئاسمانە ،
دوو چاوی نەخشاوو برژانگی درێژی
جوانی‌یە ، خەیاڵە ، مەستی‌یە ، ژیانە
دوو باڵی کۆترەو گوڵباخی سپی‌یە
پرشنگی ئارەزووی ڕەنگینی دڵانە
پەپوولەی سووك باڵی نەخشاوە هەڵدەفڕێ
دەستێکی ئەستێرەی خەیاڵی گەش ئەگرێ

دەستێکی راهاتووی کەمانی دڵانە

— مردنیش پێی قورسی بە سامو گرانە
بێ گوێیە ، بێ هەستە ، بە سامو دزێوە
خەریکی سەمایە ، بەڵام ئاخ نەدیوە
داخەکەم هەر منم ، ئەبینم هەنگاوی
وا تێکەڵ هەنگاوی فرشتەی سەمایە !
هاوارکەم ؟ بگریەم ؟ ها ! ٠ دەنگم دەرنایە ٠

— ٢ —

مەی ئاهەنگ هەتادێ کەللەمان دائەگرێ
سەمای خۆش چێن بە چێن تەلیسمی هەڵئەفڕێ
بەهەشتی تەماشا رازاوەو رەنگینە
مۆسیقا لەشکری شادی‌یە ٠٠ گڕئەگرێ ٠

هەموو شت سەرمەستە ٠٠ سەماکەر بێ‌پەروا
وا هەڵچوو ، پڕیشکی ئاگرە ، خولئەخوا ،
هەنگاوی نارێکی مردنی تێکشکان
بۆ ئەوەی لە شانۆ رۆژهەڵبێ ، رۆژی جوان ٠

رۆژهەڵات ٠٠ هەموومان شاگەشکەی شادی بووین
بە کێوی هونەری سەمادا هەڵئەچووین
سا چیتر قەرەنتۆی مردنم نەبینی

کە شانۆ دابگرێ بە سەمای نەهینی
خاتوونی سەماساز ئەم ساڵو هەموو ساڵ
بە هەوای ئاوازا پڕ بە دڵ ئەینا باڵ .

— ٣ —

لە « سێرکا » پاڵەوان لە شوێنی بەرزەوە
کە دڵمان بەبێ هەست ئەخاتە لەرزەوە
کە بەسەر مردنا زاڵ ئەبێ ، بە سەد جۆر
پاداشتی ئەدەینێ : هاوارو چەپڵەی زۆر .

کە وون بوو ، ئەو ساتە چوزانین بۆ کوێ چوو ؟
ئەستێرەی ئاسمان بوو ، هەڵرژا ، وەك نەبوو !

— ٤ —

ئەو لەشەی کە دەتگوت رووناکیو گوڵاوە
وا لە ژێر پێخەفی مردنا گەچڵاوە
خەریکی نۆشینی تاڵاوی مردنە
سەرگێژی رابردوو و ژیانو خەوتنە
بەبێ کەس ، پاڵکەوتووی ژێر تیغی ئازارە
فرمێسك لە چاویا رەقماوەو بێزارە
لە نێوان تاریکیی ژوورەکە ، لە ناکاو
بای لەشێك رووناکی شانۆیەك کەوتە ناو
یەکێك هات ، شێتانە هەنگاوی هەڵئەبڕی

چ سەما ! دەماری ناو مێشکی ئەپچڕی

ـــ « وانابێ • بیبڕەوە • نەخۆت کا و نە سەمات

وا من دێم سەماکەم ، تا دەمی ڕۆژهەڵات ! »

وای ووت‌و ڕاچڵەکی •• ئارەزووی سەمای کرد

لە یەکەم هەستانا ، تێك شکا ، ئنجا مرد •

١٩٦٦

## هونەروەرێك
## لەسەر نوینی نەخۆشی

کە هاتمە ژوور
ئەمدی دلێك :ـ گولێکی سوور
هەلڕژاوەتە سەر جێگاو دۆشەگی بۆر ،
ناوچەوایێك : دەریایەکی بە شلپو هوورِ
شەوێکی بە ماتی چنراو
شەوێکی مات : لە ماتیدا
فیرنەگولەیەك ئەخوێنێ
باریك باریك ، بە ئاوازی دلی بڕاو
چریکەی نزمی لەناو قولپی خوێنی دلا
سەرهەلدێنێ ..
ڕشتەی فرمێسکی هونەری
چاوی نازداران ئەپسێنێ !!



بالی مەرگە سێبەر دەکا ؟

سەرنجی چاو هەڵنەگرێ
بۆ دوور ، بۆ دوور ..
تا جیهانی لێ وون دەکا ؟!
ئایا هەرگیز پەڕەمووچی باڵی مردن
بەسەر دەریای یادگارا
کە لە شارو دێی ئازارا
گوزەر دەکا ...
پەڕەی ژینی بلوورینی دڵ تەڕ دەکا ؟
کە هەر مردن سێبەر دەکا
نائومێدی وەك سروشکی
نازدارێکی پەنجەت کردوو
ئایا شوێن پێ جێ ئەهێلێ ؟
یان چەند رەنگێ ، شێوەو هێلێ
لە نیگاری ئەم ژیانە
لەژێر پەنجەی ووردتدا ئایا سەر دەکا ؟
کە هەر مردن سێبەر دەکا ؟



من تەمەنی کورتی لاویم
کە بە ئازار رەنگ رێژراوە
لەناو تەمی تەڵخی چەرخا
گەر تروسکەی گەل نەبوویێت خۆی بۆ دەرخا
دلم وەکو گولی خەزان تێك شکاوە :

« داد لە دەس مەرگ ! لە دەس رەنجی
تۆقێنەری کۆرپەی گەنجی
شکستە باڵ
کەوتووەمەتە بەردەم هێزی
ئێستاك قورسی مردنی تاڵ . »
من یەکێکم مات و خەمڵین
چی نووسیومە : بەدو رەنگین
خۆ شیعر نین !
هەناسەیەک .. یان ئاهێکی پڕ لە سۆزو ئاواتی گەش
گوایا ئەبێ بە سۆزێکی بلوێری دەم جەلالەددین ؟
فرمێسکێکە .. نازانم کە کەی رشتوومە ؟
ئایا تێکەڵ بە فرمێسکی ئێوە بووە ؟
هەچ هۆنراوەی من ووتوومە
گەڵایێکە پاییز رەنگی لێ بردووە .



تۆ بەهاری گوڵی شیعری پڕشنگداری
ئەتۆ گەوهەر هەڵسەنگێنی
دێر زەمانی کوردەواری
با دڵت هەر بەهەشتێک بێ
سەماو ئاواز ، هیوای گەش و بڵێسەدار
بلبل و گوڵ هەزار هەزار ..
بە پرشنگی گەلاوێژی بلیمەتیت

جۆش‌دەن ئاسمانی رۆژگار
تا تێبگەم سەرسامانە
چۆن سەرناکا لەژێر پەنجەی هونەریتا
کزترین هێڵ لە دیمەنی ئەم ژیانە •



جا شایانی ئاسمانی قارەمانی
رۆڵەی خۆری هونەروەریو
هیوای دڵی مرۆڤانی
بەڵام چبکەم ؟ چی بڕوانم :
شەوو دڵو گوڵی پێچراو لە نوینی بۆر
ناوچەوانی : شەوێکی مات
دەریایەکی بە شڵپو هووڕ
قژی سپی لارکەوتووی خەم
چەن پێست نامەی تۆزاویو تەم •

١٩٦٢

# لاشەی بیسەرو شوێن

کە چاوم کردەوە
لە دنیای ئاڵۆزا
تێهەڵچووم ، روو بە رووی گەرداوی
زەمانی دڵرەقی بێسۆزا
نازانم ، گرەوم بردەوە
بەڵام هەر کە چاوم کردەوە
دیم لاشەم ئەسپێکی بێجڵەو
وا هەڵی گرتووە ..
دێ بە دێ
شار بە شار ئەم گێڕێ ،
ملی لار ، قاچی شل تەکەی دێ !
کوا یەکێ
لە کووچەو گەرەکێ
لە لاشەم بپرسێ
لە لاشەم نەترسێ ؟
وام بەسەر ئەسپەوە زامدارم

چۆڕاوگەی خوێنەکەم بێخوڕەو بێدەنگە
تەنانەت لەو دەستەی کە بۆتە خوێنخوارم
بێگوێیە ، بێدەنگە
نایناسێ
قەیناکا .. نەیناسێ



وام لەناو بیابانا ،
تیشکی خوێ دروشمی سووتاندم
گەردەلوول وەك بڕبەند
سەرتاپای رووشاندم ،
ئەی ئەسپی بێجلەو
سا بۆ کوێت رەتاندم ؟
من سنگم کە دەمی برینی والآیە
کانیاوی نزارو قەدپاڵی تێدایە
برینی شەماڵی ژێر سایەی ئاڵایە :
ئاڵایەك روو بە رووی گەرداوی
زەمانی ئاڵۆزا چەقاندم !



کە لاشەم لە خاك بوو
هەر کەسە پێیەکی لە لاشەم بەخوێنکرد
تا گەڕی شایی خۆی تەواوکرد

کە کەللەی مەستی مەی شەیتانی ناپاك بوو ،
دوای ئەوە مەی بڕا •••
تەپلەکەی لێدڕا ••
ڕووبەڕووی مردنی سامناك بوو ،
هەر کەسە بە بیروباوەڕم
کەوتە لاوانەوە •••
هەر کەسە بە قسەی شڕۆڵو ونجڕم
هاتە مەیدانەوە ••
مەیدانیان لێ پڕکرد ،
بە هەڵپەو دەستوبرد
بەڵام من ••
وا لاشەم نەك جارێ
هەر جارە بارانی ئاگری بەسەردا دەبارێ ••
با بە ناو جەنگەڵو دەوەنا
با بە ناو کارخانەو بازاری وەتەنا
دێ بە دێ
شار بە شار بم گێڕێ
ڕۆژێ دێ ، لە لاشەم بپرسن
لە لاشەم نەترسن

١٩٧١

# مردنو دڵداری

بێ سەرەتا • بێ سەرو شوێن
دڵم بە خوێن
تەونی چیرۆکی تەمەنی خۆشەویستی
کە ئەتەنێ
مۆمێکی لاوازی بێناز
لە ژوورێکی کشو ماتا
بێدەنگ ، بێهاوار ، بێ ئاواز
هەر بە تەنێ
گڕی فرمێسك
دەمەیێنێ ، لە دامەنی
تاریكو تەڕی تەمەنێ •



سوارچاکێك بوو
لە مەیدانی دڵداریدا
لە ئاسمانی سەرگەرمی هەرزەکاریدا ،

له دوا هەوری زێڕینەوە
راوی پەڕەی هیوای ئەکرد
بۆ رووی مانگی مانگ ڕوویانا
پەیژەی کوڵو سەودای ئەبرد
سەرگەرمی بەهاری لاوی
جۆشی دەروونی گراوی
له مەیدانی سوارچاکانا وازیی ئەکرد
بە هەڵبەستی
خۆشەویستی
خوای دلداری رازیی ئەکرد
هەی داخەکەم بۆ رۆژانێ
بۆ چاوبڕکێ ، گەمە ، ژوانێ
بۆ بەستەیەك هەر خۆم بیلێم
نابێ هیچ کەس پێی بزانێ :
« دنیای دواپەرژینو درزی زەقکردوو چاو
دوا چیغی سەربانو دەرگای
گالەدراو ..
جیهانێك بوو
تا چاو بڕکا سەوزیو بەراو !
جیهانێك بوو
تا سەر بیگرێ بیری کرژو دڕو ناکاو !
سەحرایەك بوو :

مێرگێکی تێراوی لەناو ! •
ئارامگا بوو •• لەرزەی ئەژنۆو
جیرەی جومگەو
خورپەی دڵی وێرانە بوو
ورێنە بوو •• ئەندێشە بوو
خەمخانە بوو •



پەریی خەیاڵ
سنگی سینیی مەیخانەیە ،
شەیتان بە بازووی ئارەزووی
ستەمکاریی
ئەوا هەر خەنجەر دەژەنێ
لە لەشی نەرمو نازداری
— ئەی سوارەکەی پەناگرتوو
بگە فریای پەریی کەوتوو !
— پەریی چی ؟ هاتو هاواری
هەوای
سەمای
ئارەزووە ،
ئاخو داخی مووچڕکێکی
هەناوی گڕ تێبەر بووە •
ئازاری زامی خەنجەرێ

خۆشنوودی‌یە !
تەنیا بۆ تۆ
— ئەی سوارچاکی پەناگرتوو
مایەی کرژیی تەلی بیری بێ سوودیی‌یە ‎•
سوارچاکەکەی مات‌و غەمگین
سەری هەڵگرت بۆ دوور بۆ دوور ،
بۆ شەڕی ڕێکەوتی زەوی‌ی پان‌و بەرین
بەرەو سنوور ‎•
سنوور چی‌یە ؟ نانە ، ژنە ، تێکۆشانە ؟!
— با تێکۆشین فەرشی زەویی هەموو گوڵ بێ
با نان گوڵ‌و کەرەو هەنگوینی ناو دڵ بێ
ئەی ژن ؟؟
— ڕێگەی هات‌و نەهات !
با سوارچاکێ سەری دێشێ
بۆ سەر چەلی ، بۆ کارەسات
وێڵ بێ ، ڕێگەی دێوان ببڕێ
تا سەرشاری « سنوور » ئەگرێ ‎•

— ٢ —

سروشتم گرتە باوەشم
دای‌گیرساند گیانی منداڵم
خۆشەویستی‌ی
باوەشێك بوو بۆ باوەشم ‎•

ووشەی تەڕی شەونمی سەر گەڵاکانی
پڕشنگێکی هەمە رەنگ بوو
بە بریقەی خست ، بریقەی ساوای
چاوی رەشم •
بەڵام سروشت ،
هەموو جوانی
هەموو نازی دیمەنو چاوەندازانی :
گردێك بوو •• گۆڕی دایکمی لێ دیار بوو
کە بەهار بوو ••
سەوزەگیای رۆخی گۆڕەکەی
زوڵفی رەشی گوڵاودار بوو •
کە پاییز بوو ••
پووشی زەردو دڕکی تیژی
دەوری پەرژینی ئەڤینی
لێ نەچەشتووی یادگار بوو •
لقی داری
چڵو پۆپشۆڕ ،
باسکی گردان ،
راکشانی لەشولاری
ماتی ئەو بوو ـ لەشی ناو گۆڕ ! ـ
( سروشت ، دایك ) •• ( ژین و مردن )
لە دلداریی سەرگەرمیما لەیەکم‌دان
لە دڵا تێکەڵم کردن !

ئەی ژیانی سەرەنجامی
مەرگ‌و ژینی فامی خامی
منالێکی دڵداری خواز !
بە کام گوڵاو پەپوولەکەی راکێش ئەکەی ؟
لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ ، بێ‌نیاز
وەك پەرێ دەی‌هێنی‌و دەی بەی ؟
من دڵداری دڵی ماتی ناو تاریکیم
بۆیە بێ‌هەستی ئەنجام بوو - ئاخ ! - خەریکیم
بە بۆنی هەڵاڵەی گوڵان
لەم چڵ بۆ ئەو چڵ .. بێ‌ووچان . .



درزی دەرگا
شەرمی جێگا
ووشانەوەی کانی‌ی نازی سەرەتاکەم
لە دارستانی ساماناکا
جڵەودار بووم ، نەم دەتوانی بۆ کوێ راکەم !
پەپوولەی گێل
نەشئەی گیان ،
نە ئەو ساتەی بارتەقایە بە هەموو سات ،
هەموو ژیان !
نیگای چاوی
لە داوێن‌و نزمی‌یەوە

هەڵ نەکشاند ،
تا بڕوانێ بۆ ٠٠ ئاسۆی گیان
ئاسۆی پاکیو وەرزی لاوی

— ٣ —

با مەرگو ژین ، کە سیبەرو کە هەتاوە
سێبەر : قوولیو ماناو رازە
گڵەکەی گۆڕی شێداری
دایکو رووگەی رازو نیازە ،
نیشتمانە ٠
کام نیشتمان ؟
مشتە خۆڵی ژێر چەپۆکی دووکەڵاویو
ژەهراویو ژان ،

★

سێبەر نەك تاو
مەرگ نەك ژین
دەتپەرستی دڵداری مەرگ !
ئەی گۆڕ ، ئەی جوانی
وەی هەستێ
لە ناخی گیانم هەڵدەستێ
تۆم لا جوانی
ئەی نازداری قوڕو خوێنو دنیای تاریك
قوربانت بم ، بە قوربانی ٠٠٠

منی بێ تۆ ،
بێ لانەی تۆ
دوور و بیانی •



لە گوزەرو کووچەی شارێ
کام چاوی ڕەش بۆم ئەنوارێ
هەر هەتاوە ،
گیانی بێ سێبەرو خاوە •
— من بێگانەم
من هەژاوی بێ زمانو خانو لانەم
سەوداگەری لاشو لارم
من کڕیارم !
— بەڵام کڕین لای دڵداران ڕسوایی‌یە
بێ باوەڕی ، بێ سەرەتاو بێ دوایی‌یە :
سەرەتا ؟
بێ خورپەی خەستی هوشیاری‌یە !
دوایی ؟
ئاوریشمی سەردڕکی
وونیاری‌و نادیاری‌یە
لە نێوان کاتو ناکاتا
لە نێوان ژینو نەبوونی کشو ماتا !!

بەڵام باوەڕ ،
با خۆرشتی
ڕێگەی گەشتی تەنیایی بێ ،
لە سەرنجی دامەنەوە
هەڵکشانی تێڕوانینی باڵایی بێ
بۆ ئەو خەڵکەی لە سێبەر دان ،
لە سێبەردان ،
لە ژێر سایەی وەك مس قورسی
گۆڕستان دان •
بۆیە لای دڵداری شەیدای من ئاسایی
جوان بوون ، جوان بوون !
بۆیە ڕێگەی مەرگم لەلا ڕێگای ژین بوو
بۆ قوربانیو سەردانانی ڕێ شایان بوون •
خۆشەویستی بەزەبرو بەجەرگم دەوێ
با هەر بڵێین مەرگی دەوێ ! مەرگم دەوێ !
کەوا شۆرش ڕێی دڵداریو ڕێی ژیانە
کەوا ڕێگەی دڵداریو ژین ڕێی شۆرشە ،
ڕێی دڵو بیر ڕێی ژیانە
ڕێگەی مەرگە ، مەرگی جوانە •

# ماڵ ئاوایی

پەپوولەی دڵ
لەسەر کولمەی
گوڵی ئێوە دەبێ هەستێ !
ئەزانم کاتی لێکبوونە
بەڵام فرمێسکە ناوەستێ .

* * *

زمانم لاڵ ئەکا بۆ دەربڕینی
هەستی پڕ جۆشم ،
ئیتر ئارام
مەگەر پردێك
لە ئەم نێوانە هەڵبەستێ .

* * *

لە قووڵایی دەروونا
دەرپەڕی

ئارامی سووتاوم ،
چ هیوایەك
ئەبێ هێزێکی وەك جارانی تێپەستێ ؟

* * *

لە پاش ئەم پێك گەیینە
دەردی دووری ئێوە وا سەختە
وەکو لافاو
گولی دڵ ، قەت
بە زەبری هێزی ناوەستێ !

* * *

گولاوی خۆشەویستی ئێوە پەخشانە
وەکو پرشنگ :
لە هەر چاوێ ..
لە هەر سنگێ ..
لە هەر لێوێ ..
لە هەر دەستێ .

* * *

وەلامی ئێوە
ـ داماوم ـ
بە هەلبەستێك تەواو نابێ

به تەنیا چۆن
هەڵی ئەگری
تەنی لاوازی هەڵبەستێ ؟

* * *

لە دوور ڕا
ڕاتەکێنن دەستەسڕتان ،
وا لە دەریادا
وەکو ( چارۆگە )
کەشتیی دڵ ئەبا
ئەڕواتو ناوەستێ .

# پێرست

لاپەڕە

الجمهورية العراقية
وزارة الثقافة والاعلام
دار الثقافة والنشر الكردية
سلسلة الشعر (١٩)

# ديوان البنفسج

شعر

عبد الرزاق بيمار

تصميم الغلاف شكر جاسم

دار الحرية للطباعة

السعر [redacted]

توزيع الدار الوطنية